# ناوم گوناحە

کەشکۆڵی شیعری کرمانجکی (زازاکی)





ئامادەکردن و داڕشتنەوە: ژیار هۆمەر



# ناوم گوناحه

## کەشکۆڵی شیعری کرمانجکی (زازاکی)

ئامادەکردن و داڕشتنەوە:

ژیار هۆمەر





وەشانخانەی کەشکۆل

سلێمانی

٢٠٢٣

**Kashkul** is a research, preservation, and translation collective composed of students and scholars based at the American University of Iraq, Sulaimani. Kashkul Books publishes both classical and contemporary writing translated by the collective, as well as artist catalogs that accompany exhibitions it curates and occasional special projects. For more information, or to make a tax-deductible donation, please visit *kashkul.com*

Kashkul Contemporaries Series, Book 3

Edited by Jiyar Homer



Proofreading by M. Malmîsanij

ISBN: 978-9922-9257-6-9

Design and typesetting by Verbum.Media

Printed in the Kurdistan Region of Iraq

Suggested price: 3000 IQD





**Kashkul Books**
Sulaimani

**کەشکۆڵ** ناوەندێکی توێژینەوە و پاراستن و وەرگێڕانە، پێکهێنەرانی خوێندکار و زانیارانە، سەر بە زانکۆی ئەمریکی لە عێراق، سلێمانییە. وەشانخانەی کەشکۆڵ پەرتووکی کلاسیک و هاوچەرخ وەردەگێڕێت و بلاو دەکاتەوە. سەرەرای کردنەوەی پێشانگا و ڕێکخستنی بۆنەی تایبەت، کەتەلۆگی هونەرییش بلاو دەکاتەوە. بۆ زانیاریی زیاتر یان پشتگیریی ناوەندەکە، تکایە بڕوانە **kashkul.com**

زنجیرەی هاوچەرخی کەشکۆڵ، پەرتووکی ٣

ئامادەکردن: ژیار هۆمەر



پێداچوونەوە: م. مالمیسانژ

ژپنک: ٩-٦-٩٢٥٧-٩٩٢٢-٩٧٨

نەخشاندن و پێتچنین: *Verbum.Media*

لە هەرێمی کوردستان چاپ کراوە

نرخ: ٣٠٠٠ دینار





**وەشانخانەی کەشکۆڵ**

سلێمانی

# پێڕست

ناساندنی کرمانجکی (زازاکی) و وێژەکەی
م. مالمیسانژ
هێراکلیتوس / *Herakleîtos*
دڵدار / *Waşta*
ناوم گوناحە / *Namê mi gune*
ڕەحمەت شەریفیی سەردەشتی / *Rehmet Şerifiyê Serdeştî*
ئیحسان ئەسپار
بەخت / *Bext*
بۆنی یاسەمین / *Boya yasemînan*
بۆت دەگەڕێم / *Ez to gêrena*
پرس / *Persî*
ناکۆکی / *Nakokî*
تۆغر سەرمییان
غەریب / *Xerîb*
سیمورغ / *Sîmurx*
بەدریە تۆپاچ
میوانی چاوم / *Mêmanê çimanê mi*
من و تۆ / *Ez û ti*
ئیدریس پازار
پەیکی کازیوە / *Qasida şefeqî*
تێبینی / *Notî*
ژیاننامە



# ناساندنی کرمانجکی (زازاکی) و ویژەکەی

چەند پەیڤێک بۆ ئاماژەدان بە کوردیی کرمانجکی هەیە. خۆیان ئەم چوارە «زازاکی، دملکی، کردکی و کرمانجکی» بەکار دەهێنن. «زازا» و «دمل» ناوی هۆزن، «کرد» و «کرمانج»یش لە ڕەچەڵەکەکەیانەوە هاتوون. گرووپی ڤاتە بیستوحەوت ساڵە لە هەوڵی بەستاندارکردنی ئەم زاراوەدایە و «کرمانجکی»ی هەڵبژاردووە، بۆیە ئێمەیش ئەوە بەکار دەهێنینەوە.

کوردی کرمانجکیئاخێو تەنیا لە باکووری کوردستان و پتر لە شاری ئامەد، چەولیگ، ڕحا، سەمسوور، سێرت، بەدلیس، دێرسم، مووش، ئەرزنگان و خارپێت دەژین. هەرچەندە ئامارێکی تەواومان لە بەردەستدا نییە بەڵام زۆرینەی خەڵکی چەولیگ و دێرسم بە کرمانجکی دەدوێن، هەروەها گەلێک کرمانجکیئاخێویش لە سنووری پارێزگای ئامەددا هەن. پێدەچێت ڕێژەی کوردە کرمانجکەکان سێ-چوار ملیۆنێک کەمتر نەبێت.

هاوشێوەی زاراوە کوردییەکانی تر، کرمانجکییش چەند شێوەزارێکی هەیە و دەتوانین بەم شێوەیە پۆلێنی بکەین: دێرسم، مووش و ئەرزنگان زۆر لە یەکەوە نزیکن. کرمانجکیی ڕحا، سەمسوور و چەرمووگیش هاوشێوەن. شێوەزاری سێیەم کرمانجکیی هەندێک ناوچەی ئامەد و خارپێت و چەولیگە، کرمانجکیی ناوچەی مۆتکیی بەدلیسیش بۆ خۆی شێوەزارێکە.

کرمانجکی لە چاو زاراوەکانی تری کوردیدا زۆر درەنگ پێی نووسراوە. پیتەر ئیڤانۆڤیچ لێرخ یەکەمین دەقەکانی کرمانجکیی کۆ کردووەتەوە. ئەم دەقانەیش ساڵی ١٨٥٨ لەگەڵ فەرهەنگێکی ڕووسی-کرمانجکی لە سەنت پیتەربورگ بڵاو بوونەتەوە.

دەقەکان لە دەمی چەند کرمانجێکەوە نووسراونەتەوە. ئەم کرمانجانە لە شەڕی ڕووس و عوسمانیدا بە دیل گیراون و بۆ ڕووسیا براون. وەک دەزانرێت، لێرخ دەقی کوردیی باکووری (کورمانجی) پێشی کۆ کردووەتەوە. مرۆ دەتوانێت بڵێت ئەوانە یەکەمین دەقەکانی کرمانجکین. پاشان ئەوەی بەردەستە کورد خۆی نووسیوونیەتەوە. مەلا ئەحمەدی خاسی یەکەمین کتێبی بە کرمانجکی نووسیوە. ساڵی ۱۸۹۹، خاسی مەولوودنامەکەی خۆی لە ئامەد بە کرمانجکی نووسیوە و چاپ کردووە. دواتر لە ساڵی ۱۹۰۳، عوسمان ئەفەندی بابژ مەولوودنامەیەکی تری نووسیوە. عوسمان ئەفەندی خەڵکی سێوەرەگ بووە. ساڵی ۱۹۳۳، میر جەلادەت عالی بەدرخان مەولوودنامەکەی لە شام بۆ چاپ کردووە. دوای ئەم مەولوودنامانە تا ساڵی ۱۹٦۳، هیچ شتێک بڵاو نەکراوەتەوە. ساڵی ۱۹٦۳، دوو نووسینی کرمانجکی لە ڕۆژنامەی «ڕۆژا نەوە»دا لە ئەستەمبووڵ دەرچووە، یەکێکیان سترانێکە و ئەوەی تریان بیرەوەریی کوردێکی ڕاگوێزراوە. ناوی ڕۆژنامەکەیش خۆی بە کرمانجکییە.

دوای ئەم دوو مەولوودە، محەمەد شێخ ئەنساری لە ساڵانی ۱۹٤۷-۱۹٤۸دا پەرتووکی ئایینیی نووسیوە بەڵام ئەوسا بڵاو نەبوونەتەوە. ساڵی ۲۰۱۷، بیلال زیلان کاری لەسەر کردوون و بڵاوی کردوونەتەوە. پاشان لە گۆڤار و ڕۆژنامەی وەک ئۆزگورلوک یۆلو، ڕۆژا وەلات، دەڤریمجی دەمۆکرات گەنچلک و تیرێژدا بە کرمانجکی نووسراوە. ئەو گۆڤار و ڕۆژنامانە لە نێوان ساڵانی ۱۹۷۰ تا ۱۹۸۰ لە باکووری کوردستان بڵاو بوونەتەوە.

گۆڤاری تیرێژ پێگەیەکی تایبەتی لە مێژووی نووسین بە زاراوەی کرمانجکیدا هەیە. بەر لە هەموو شتێک، گۆڤاری تیرێژ یەکەمین گۆڤاری وێژەیی و فەرهەنگیی کوردیی باکووری کوردستانە. تایبەتمەندییەکی تری تیرێژ

ئەوەیە بە هەردوو زاراوەی کوردی، نیوەی کوردیی باکووری و نیوەی کرمانجکی، بڵاو بووەتەوە. دەتوانین بێژین یەکەمین نموونەکانی وێژەی هاوچەرخی کرمانجکی سەرەتا لێرەدا وەشاوە. گۆڤاری تیرێژ چوار ژمارەی لەسەر یەک دەرچووە، ژمارەی یەکەمی لە ساڵی ۱۹۷۹ و ژمارەی چوارەمیشی بەر لە هاتنی حوکمی لەشکری لە ساڵی ۱۹۸۰ لە ستۆکهۆڵم بڵاو بووەتەوە.

ساڵی ۱۹۸۰، هۆنراوەکانی سەرەتای کرمانجکی لە ژمارە دووی گۆڤاری تیرێژدا هاتووە. دوو هۆنراوەیان هیی م. مالمیسانژ و دوو کورتەهۆنراوەی تریش هیی کەسی ترە بە ناوی خوازراوەوە. هەروەها لەم ژمارەیەی تیرێژدا یەکەمین چیرۆکی کرمانجکی بڵاو بووەتەوە، ئەویش مالمیسانژ نووسیوویە.

ساڵی ۱۹۸۰، حکومەتی سەربازی لە تورکیا هاتە سەر حوکم و هەموو چالاکییەکی وێژەیی، ڕامیاری و چاندی قەدەغە کرا. زۆرینە کوردە ڕووناکبیر و سیاسییەکان چوونە دەرەوەی وڵات. بێگومان لە نێویشیاندا کوردی کرمانجکیئاخێو هەبوو، ئەوانەی خەریکی زمان بوون و لەسەری دەدوان. تاراوگە چەند خاڵێکی ئەرێنیی لەگەڵ خۆیدا هێنا. یەکێکیان ئەوە بوو کرمانجکی لە دەرەوەی وڵات پێی نووسرا. ساڵی هەشتاکان تا نەوەدەکان، کرمانجکی لە گۆڤاری وەک هێڤی، ئارمانج، وان، بەرهەم و بەربانگدا پێی دەنووسرا.

ناوەڕاستی نەوەدەکان، گەنگەشەی پرسی ڕاستنووسی لە نێوان کوردە کرمانجەکاندا سەری هەڵدا. چونکە هەر کەسێک بە گوێرەی بیر و باوەڕی خۆی، بە گوێرەی شێوەزاری گوند و ناوچەکەی، دەینووسی. شتێکی هاوبەش بۆ ڕاستنووسی لە گۆڕێ نەبوو. ئەو کەسانەی دەیاننووسی، جاروبار، خۆیان لە نووسینی یەکتر نەدەگەیشتن. کەوتنە گەنگەشە، گوتیان گەر بمانەوێت ئەم زاراوەیە پێش بکەوێت، دەبێت پێکەوە کاری لەسەر

بکەین، هەندێک یاسا و ڕێسای ڕاستنووسی دابنێین. بۆیە ساڵی ١٩٩٦، لەستۆکهۆڵم، بۆ یەکەمین جار کۆ بوونەوە. لەم کۆبوونەوەیەدا ١٥ کەس، ئەوانەی بە کرمانجکی دەیاننووسی یان دەیانزانی، ئامادە بوون. بڕیاریان لەسەر ڕاستنووسی، بەکارهێنانی هەندێک بێژەی هاوبەش و کاری هەرەوەزی، دا.

ساڵی ١٩٩٧، لە دووەم کۆبوونەوەدا، بڕیاری دەرکردنی گۆڤارێک درا تا ئەنجامی ئەو کۆبوونەوانانەی تێدا بڵاو ببێتەوە. یەکەمین ژمارەی گۆڤاری ڤاتە لە گەلاوێژی ساڵی ١٩٩٧دا دەرچوو. هەتا ئێستا لە ئابی ٢٠٢٣، ٧٦ ژمارەی لێ دەرچووە. ڤاتە لە ژمارە ١ تا ٢٠، هەم لە ستۆکهۆڵم هەم لە ئەستەمبووڵ، چاپ و بڵاو دەکرایەوە. ئیدی لە دوای ژمارە ٢٠ـەوە لە ئەستەمبووڵ مایەوە.

ئەم گرووپە کرمانجکییە دواتر وەک گرووپی ڤاتە ناسرا. ئەم گرووپە تا ئێستا ٣٦ جڤینی لە وڵات و شاری جیاواز هەبووە. دەورووبەری ٢٠ کەسێک لە هەر کۆبوونەوەیەکدا بەشداری دەکەن و چوار-پێنج ڕۆژێک دەخایەنێت. ئەنجامی کۆبوونەوەکان هەم وەک فەرهەنگ هەم وەک پەرتووکی ڕاستنووسی بڵاو بوونەتەوە: ڕاستنوشتشێ کرمانجکی (زازاکی)، فەرهەنگا کرمانجکی (زازاکی)-ترکی کە ٦١٥٠٠ وشەی لە خۆ گرتووە، ترکی-کرمانجکی (زازاکی)یش ١٧٢٠٠ وشەیە.

گرووپی ڤاتە و گۆڤاری ڤاتە، ڕۆڵێکی گرنگیان لە بواری نووسین و پێشخستنی کرمانجکی و گەشانەوەی وێژەکەیدا هەبووە. بەر لە گرووپی ڤاتە، لە ساڵی ١٨٩٩ هەتا ١٩٩٦، تەنیا ٢٣ پەرتووک بە زاراوەی کرمانجکی بڵاو ببوونەوە. ئەمڕۆ ڕێژەی پەرتووکی کرمانجکی دەگاتە هەزار. گۆڤاری ڤاتە، هەم لە ڕووی قەبارە و هەم لە ڕووی ناوەڕۆکەوە، گرنگترین بڵاوکراوەی کرمانجکییە. ٧٦ ژمارەکەی گۆڤاری ڤاتە ٩٨٢١ لاپەڕەیە، تێکڕای هەر ژمارەیەکی ١٣٠ لاپەڕەیە.

تا ئێستا ٥٦ کەس بەشدارییان لە گرووپی ڤاتەدا کردووە. زۆرینەیان خۆیان چەند پەرتووکیان بە کرمانجکی یان بە زمانی تر نووسیوە. کاریگەریی گرووپی ڤاتە لەسەر نووسینی کرمانجکی هەر ئەمە نییە. گرووپی ناوبراو بە هەوڵەکانی ڕێی نووسینی بە کرمانجکی خۆش کردووە، هەندێک ستانداردیشی لە نووسینیدا داهێناوە، بەم شێوەیە خوێندن و نووسینی کرمانجکی باشتر پەرەی سەندووە.

هەتا ساڵی ١٩٩٦، تەنیا یەک کۆمەڵەهۆنراوەی کرمانجکی هەبوو، ئەویش «هێراکلیتۆس»ی م. مالمیسانژ بوو و ساڵی ١٩٨٨ وەشابوو. ئەمڕۆ ژمارەی کۆمەڵەهۆنراوە کرمانجکییەکان ٦٠ کتێبی تێپەڕاندووە. ٥٠٠ هۆنراوەیەکیش لەو ٧٦ ژمارەی گۆڤاری ڤاتەدا بڵاو بووەتەوە. وەک ئاشکرایە، هەڵبەستوانە کرمانجەکان سەرەتا هەڵبەستیان بە زمانی بیانی ناسیوە. پێش ساڵی هەشتاکان، چەند هەڵبەستێکی کرمانجکیی م. مالمیسانژ هەبوو و چەند دانەیەکی تریش هەر خۆی لە تورکییەوە وەریگێڕابوون.

جێی بایەخە هێراکلیتۆس یەکەمین پەرتووکی هەڵبەستی کرمانجکییە. لەبەر ئەوەی زۆر جاران شت چۆن دەست پێ بکات، وەهایش بەردەوام دەبێت. مالمیسانژ نیشانی دا هەڵبەست پتر لە «قیرەقیر و بۆڵەبۆڵ»ە، پتر لە «کڕووزانەوە و ڕۆڕۆ»یە. هەڵبەست تێکۆشانە، زانینە، هەست و خەیاڵە. هەڵبەست زمانە، نرخاندنی پەیڤە، ڕیتمە، ئاهەنگە.

بێگومان درەنگکەوتنی نووسینی کرمانجکی کاریگەرییەکی نەرێنیی لەسەر هەڵبەستی کرمانجکییش داناوە. بەڵام هەڵبەستوانە کرمانجەکان، هەر هەڵبەستی کرمانجکییان نەناسیوە. ئەوان بە زمانی تر هەڵبەستیان خوێندووەتەوە، هەندێکیشیان بە زمانی تریش هەڵبەستیان هەڵبەستووە. زانینە وێژەییەکەیان بۆ کرمانجکی گواستووەتەوە. بۆیە زۆرینەی ئەو هەڵبەستانەی وەک پەرتووک وەشاون، لە لایەنی زمان، ناوەڕۆک، هونەر و

پێکهاتەی هەڵبەستەوە زۆر باشن. گەر زۆریش نەبن، ئەوڕۆ هەڵبەستی کرمانجکی تایبەتمەندیی خۆی وەرگرتووە، بەردەوام لە گەشە و برەودایە. هەندێک هەڵبەستوانی کرمانج بە شێواز و بابەتی هەڵبەستەکانیان ئیدی لە لایەن خوێنەرانەوە دەناسرێن. ئەو هەڵبەستوانانەی دوو-سێ پەرتووکی هەڵبەستیان وەشاندووە، ڕۆژاوڕۆژ زێدەتر دەبن.

ئەم کەشکۆڵە، یەکەمین نموونەی هەڵبەستی کرمانجکییە وەک پەرتووک بە کوردیی ناوەندی (سۆرانی) بڵاو دەبێتەوە. هەنووکە هەر ئەوەندەمان لە تواناد ابووە و هیچ هەڵبەستوانێکی تری ئەم زاراوە شیرینەمان بە مەبەست پشتگوێ نەخستووە. هیواداریین ئەم بەرهەمە، ڕێخۆشکەر بێت تا وێژەی کرمانجکی پتر بناسرێت و بخوێنرێتەوە، بەو هیوایەی بەرهەمی ژمارەیەکی زۆرتری نووسەرانی بە کوردیی ناوەندی، ئینگلیزی، ئیسپانی و زمانەکانی تر بڵاو ببێتەوە. ناوم گوناحە بەشێک لە کارە گرنگەکانی ناوەندی کەشکۆڵە؛ ئامانجمان تەنیا وەرگێڕانی نێوان کوردی و زمانەکانی تر نییە، بەڵکوو نزیکخستنەوەی زارە کوردییەکانیشە. زۆر سوپاس بۆ هەموو ئەو هەڵبەستوانانەی بەرهەمەکانیان لەم پەرتووکەدا هاتووە.

**شووک**

**نووسیاری وەشانخانەی کەشکۆڵ**

**ئابی ٢٠٢٣**



## م. مالمیسانژ

نووسەر و شاعیر و زمانناسە. ساڵی ١٩٥٢ لە ناوچەی پیرانی سەر بە پارێزگای ئامەد هاتووەتە دنیاوە. بەشی پەروەردەی لە زانکۆی ئەنقەرە خوێندووە و ماوەی ٨ ساڵ لە کوردستان مامۆستا بووە. زوو وڵاتی بەجێ هێشتووە و ساڵی ١٩٨٢ لە سوید گیرساوەتەوە. ئێرانناسیی لە زانکۆی سۆربۆن و زمانە ئێرانییەکانی لە زانکۆی ئۆپسالا و پەروەردەناسیی لە زانکۆی لینشۆپینگ خوێندووە. ماستەری لە زانکۆی بۆرۆس و دکتۆرای لە زانکۆی زاخۆ وەرگرتووە. مالمیسانژ ساڵی حەفتاکان نووسینی بە کرمانجکی بووژاندووەتەوە. گۆڤاری تیریژی لەگەڵ چەند هاوڕێیەکیدا دەرکردووە؛ نیوەی کرمانجکی و نیوەی کوردیی باکووری بووە. ساڵی ١٩٨٧ یەکەمین فەرهەنگی کرمانجکیی داناوە. مالمیسانژ مەولوودنامەکانی ئەحمەدی خاسی و عوسمان ئەفەندی بابژی لە پیتی ئارامییەوە بۆ لاتینی گواستووەتەوە و ئەو دوو نووسەرەی بە نەوەی نوێ ناساندووە. کورتەچیرۆکی لە فارسی و تورکییەوە بۆ کرمانجکی وەرگێڕاوە. شیعر و پەخشانەکانی لە چەندین گۆڤار و ڕۆژنامەی گرنگدا بڵاو بوونەتەوە. نووسیاری بڵاوکراوەی وەک تیریژ لە ئیزمیر، هیڤی لە پاریس، ئارمانج و چارچرا و وان و چرا لە ستۆکهۆڵم بووە. سەرنووسیاری

ڤاتەیە، گۆڤارێکی ویژەیی و زمانەوانیی کرمانجکییە، بنکەکەی لە ئەستەمبووڵە. مالمیسانژ سەرۆکی کۆمەڵەی نووسەرانی کورد لە سوێد بووە، هەروەها مامۆستای زمان و ویژەی کرمانجکی لە زانکۆی ئۆپسالا و زانکۆی مێردین بووە. ٣٩ کتێبی بە کوردی (کرمانجکی و باکووری) و تورکی و سوێدی نووسیوە، ٩ کتێبیشی بۆ ئینگلیزی و عەرەبی و کوردی (ناوەندی و باکووری) وەرگێڕدراوە. نموونەی شیعرەکانیشی بۆ فەڕەنسی و ئیسپانی و سوێدی و ئینگلیزی وەرگێڕدراوە.

## هێراکلیتۆس

بە چاوی تۆ هێراکلیتۆس،
ئەوەی گوتت
هەر وەک خۆیەتی.
"پانتا ڕەی، پانتا ڕەی"
هەموو شتێک دەجوولێ، دەچێ.
"پۆلێمۆس" کە پێی دەڵێین جەنگ
هەر داناسەکێ.
جەنگ بەردەوامە، نەبڕاوەیە...
داخۆ ئاگات لێیە هێراکلیتۆس،
دەزانیت چیمان پێ دەڵێن؟
دەیانەوێت ئێمە
لە ڕووبارە کۆنەکە هەڵبکێشنەوە.

دە دەی بێژە،
ئەمە ژیرانەیە هێراکلیتۆس؟
بگرە جەنگیزی باوەگەورەیشیان بێت
کەس دوو جار لە ڕووبارێک هەڵدەکێشرێت؟

ستۆکهۆڵم، ١٩٨٣



## Herakleîtos

Bi çareyê to Herakleîtos,
ay hewawo ki to va
  hima ay hewa.
"Panta rei, panta rei"*:
heme çî herrikîyêno, şono.
"Polemos"** ki ma lej vanîm
  hima nêvindert.
  Lej bêvernî, bêpeynî...
Labelê haya to pey esta Herakleîtos,
  ti zanî se vanê ma ra?
Kenê ki
  ma rayna
  royo verîn di bişuwê.

De ti vaje,
  no aqil o Herakleîtos?
Wazena wa bawkalê yînî Cengîz bêro,
  yew ro di caran
  di finî şuwîyêno kes?

*Stockholm, 1983*

# دڵدار

دل بکەریتە دڵداری،
بلا بالیف کەڤر بی.
دڵداری هەر پیاوی ئەفرۆدیت،
دڵداری هەر ژنی ئیرۆس.

پاریس، ١٩٨٤

## Waşta

Zerri ki sînena waşta
wazena wa "balîve" "kevir" bo.
Waşta herkesî ci rê Afrodît,
waştey herkesî zî Eros.

*Parîs, 1984*

## ناوم گوناحه

مەڵێ: "قوربان، ناوت چییه؟"
لێم مەپرسه!
ناوم...
گوناحه.

پاریس، ١٩٨٤



## Namê mi gune

Mevajê "Namê to bixeyr?"
  mepersê mi ra!
Namê mi...
  gune.

*Parîs, 1984*

## ڕەحمەت شەریفیی سەردەشتی

کوردێکی مەهابادی پێی گوتم:
ساڵی ١٩٨١ پاسدارانی خومەینی،
لاوێکیان لە ڕێکخراوی
**چریکەهای فدایی-اقلیت** کوشت:
ڕەحمەت شەریفی.
ڕەحمەتی سەردەشتی،
لاوێکی لێهاتوو، بیستودوو ساڵی
چاونەترس و پێگەیشتوو.
حەوت گوللە تەرمی ڕەحمەتیی دابێژابوو.
دەپرسن: "شتی خراپتر لە مردن هەیە؟"
- هەیە.

پاسداران جەنازەی ڕەحمەتییان نەدایەوە باوکی.
پاشان دایکی چوو بۆی.
پاسدارە موسوڵمانەکان ڕەحمیان تڵیسایەوە!
لە بەر خاتری خوا،
جەنازەکەیان دایەوە دایکی.
پارەی کفن
و حەوت گوللەکەیان لە دایکی سەندەوە.
نەک هەر پارەی کفنەکەی
گوێت لێیە؟



## Rehmet Şerîfîyê Serdeştî

Yew Kurdê mehabadijî va mi ra:
1981 di pasdaranê Xumeynî,
    sempatîzananê Çerîkhayê Fedaî-Eqellîyet ra
        yew xort kişt:
    Rehmet Şerîfî.
Rehmeto Serdeştij,
    yew xorto jêhatîyo vîst û di serre
        tern û ciwan.
Hewt guley Rehmetî ginaybî.
Vanê "mergî ra xirabêr çî esto?"
    -Esto.

Pasdaran, cinaza Rehmetî nêday pêrdê ci.
Dim a maya ci şîy.
Pasdaranê Bisilmanan merhemet kerd (!)
    qandê Hûmay rê
        cinaza day may.
    May ra girewtî
        percy nimitişê cinaza
            û hewt gulan.
Percy nimitişî tenya nê,
    veng yeno to?

پارەی ئەو حەوت گوللەیەی

نابوویان بە کورپەکەیانەوە.

وێنەی پاسدار و سەربازانی خومەینی

لەگەڵ ئەو کوردە چاوبەستراوانەی

لە بەردەم لوولەی تفەنگەکانیان

بێهۆ پلەی یەکەمی لە دنیادا وەرنەگرتووە

پلەی یەکەمی مرۆخۆری ئاسان نییە!

ستۆکهۆلم، ١٩٨٢



Perey hewt gulan

ki înan lajê ci ra nay.

Rismê pasdaran û eskeranê Xumeynî

û kurdanê çimbestanê

ki lulîyanê tifinganê yînî fek a yê

xover o dereca verêna dinya nêgirewta.

Dereca verêna mêrdimwerey asan nîya!

*Stockholm, 1982*





## ئیحسان ئەسپار

شاعیر و ڕۆژنامەوان و نووسیار و وەرگێڕە. ساڵی ١٩٥٦ لەناوچەی پیرانی سەر بە پارێزگای ئامەد هاتووەتە دنیاوە. ساڵی ١٩٧٩، پەیمانگای پەروەردەی تەواو کردووە. ماوەیەکی کەم مامۆستایەتیی کردووە. پاش هاتنی ئیدارەی سەربازی لە ساڵی ١٩٨٠ کوردستانی بەجێ هێشتووە و لە ١٩٨٣ەوە نیشتەجێی سوێدە. مێژوو و پەرەپێدانی زمانی لە زانکۆی ستۆکهۆڵم و زانستە کۆمەڵایەتییەکانیشی لە زانکۆی یاڤلە خوێندووە. ساڵی ١٩٩٨ وەک مامۆستای زمانی کوردی لە ستۆکهۆڵم دامەزراوە، ئێستایش مامۆستای سەرەتایی و ئامادەییە. ساڵی ١٩٩٧ بووەتە ئەندامی بەڕێوەبردنی ڤاتە و لە ژمارە ٤٤ەوە بەرپرسی ئەم گۆڤارەیە. هەروەها لە ساڵی ٢٠٠١ەوە نووسیاری وەشانخانەی ئاپێکە. ئیحسان ئەسپار لە ساڵی ١٩٩٦ەوە ئەندامی گرووپی ڤاتەیە و هەوڵیان بۆ بەستانداردکردنی کرمانجکییە. ٨ کتێبی بە کوردی (کرمانجکی و باکووری) و تورکی نووسیوە، ١٧ کتێبی منداڵانیشی لە سوێدییەوە بۆ کوردی (کرمانجکی و باکووری) وەرگێڕاوە. هەروەها ڕۆمانێکی حەسەنی مەتێی بە کرمانجکی داڕشتووەتەوە.

## بەخت

ئەمشەو میوانم هەیە.
بێدەنگی و تەنیایی هاتوون
ئێستایش
چاوەڕێی خەمم...



## Bext

Emşo mêmanê mi estê.
Bêvengî û tenayî amey
û nika zî
ez xemgînî pawena...

## بۆنی یاسەمین

ئەمشەو تەنیا گوێ بۆ سترانەکانی تۆ ڕادەدێرم.
تەنیا شیعرەکانی تۆ دەخوێنمەوە ئەمشەو.
لە بن ئاسمانەکەی تۆ تەنیام.
تەنیام لە شارەکەی تۆ.
تەنیا ڕێی دڵ دەبڕم.
تەنیا دەرگای تۆ دەکوتم.
تەنیا بۆنی یاسەمین هەڵدەمژم.
تەنیا ڕۆحم هەڵدەلەرزێت ئەمشەو.
تۆ باوەڕ ناکەیت
بەڵام ئەمشەو تەنیا لەبەر تۆ دەژیم...



## Boya yasemînan

Emşo deyîranê to tena ez goştarena.
Şîîranê to tena ez wanena emşo.
Binê asmênê to de tena ez.
Ez tena ya bajarê to de.
Rayîrê zerrî ra tena ez şona.
Ez tena berê to kuwena.
Boya yasemînan tena yena mi.
Tena ruhê mi lerzîyêno emşo.
Ti bawer nêkena
la emşo ez tena seba to ciwîyêna...

## بۆت دەگەڕێم

تۆ وێنەی ئەشقت دەکێشا
بە قەڵەمی نیگارکێشان
منی سواری ئەسپی کەحیل
تۆ بوویت مەنزڵەکەم.
وەک ڕۆژی لەدایکبوونی مەسیح
پیرۆز بوو ئەو دەم.

چاوی خۆم دەپاراست
لە هێرشی نیگاکانت.
چونکە من تەنیا ڕوانینت
چونکە من تەنیا بزەت
چونکە من تەنیا
خۆشویستنت دەناسم.



## Ez to gêrena

To resmê eşqî viraştinê
bi qelema nîgarkêşan
ez esparê estora kihêle
menzîlê mi ti bîya.
Sey roja bîyayîşê Mesihî
pîroz bî a game.

Mi çimê xo pawitinî
awiranê hêrîşkaran ra.
Çunke ez tena ewnîyayîşê to
çunke ez tena huyayîşê to
çunke ez tena
heskerdişê to nas kena.

## پرس

قەت دڵتەنگی سکاڵای لە گەرووتدا عاسی کردووە؟
قەت ژانی ڕۆح زمانتی گران کردووە؟
قەت هاوسەنگیی میشکت تێک چووە؟
قەت بەرەبەیان چاوت وەک چاڵەشەراب بووە؟
قەت مات و مەلوول لە ئاسۆت ڕوانیوە؟
قەت تیریژی ڕۆژ ڕزگارکەرت بووە؟
قەت خۆت خستووەتە بەختی قەڵەمەوە؟
براله، ڕاست بێژە!
قەت بێ ئەڤین
قەت بێ یۆتۆپیا ماویتەوە، گەلۆ؟
گەر دەڵێیت "بەڵێ"
دەزانیت باسی چی دەکەم.



## Persî

Çi rey tengîya zerrî ra vate qirika to de asê bîyo?
Çi rey sancîyê ruhî ra ziwanê to giran bîyo?
Çi rey mêzînê mezgê to xirabe bîyo?
Çi rey serê sibayî çimê to bîy çala şerabî?
Çi rey ti bi xeyalanê melulan ewnîyayî asoyî ra?
Çi rey tîrêjê rojî bîy felatê to?
Çi rey to xo eşto bextê qeleme?
Birako, rast vaje!
Çi rey ti bê eşq,
çi rey ti bê utopya mendî gelo?
Eke ti vajî "e"
ti zanî ez behsê çîyî ken

# ناکۆکی

من خۆشم دەوێیت
تەنیا بۆ ئەوەی بیرت بکەم!
تۆ بیرم دەکەیت
تەنیا لەبەر ئەوەی خۆشت دەوێم!



## Nakokî

Ez to ra hes kena
tena seba ke ez bêrîya to bika!
Ti bêrîya mi kena
tena seba ke ti mi ra hes kena!





## ئۆغر سەرمییان

مامۆستا و شاعیر و وەرگێڕە. ساڵی ١٩٨٧ لە قەزای خۆزاتی سەر بە پارێزگای دێرسم هاتووەتەوە دنیاوە و تا شەش ساڵی لەوێ ژیاوە. دوای ئەوەی ساڵی ١٩٩٤ گوندەکانی دێرسم سووتێنراون،ماڵباتەکەی ڕوویان لە شاری مانیسا کردووە. ساڵی ٢٠٠١ گەڕاوەتەوە وڵات و لە شاری خارپێت نیشتەجێ بووە. بەشی زمانی ئینگلیزیی لە ئەسکیشەهر خوێندووە. ساڵی ٢٠١٠ وەک مامۆستای ئینگلیزی لە ئامەد دەستبەکار بووە. ساڵی ٢٠١٥ ماستەری لەسەر کرمانجکی لە بەشی کوردۆلۆژیی زانکۆی مێردین وەرگرتووە و تێزەکەی لەسەر تایبەتمەندیی کرمانجکیی دێرسم بووە. کتێبی «فرمێسکەکانی گرانیا»ی ئێلیزابێس نۆلانی بۆ کرمانجکی وەرگێڕاوە. ئۆغر بە شیعری «برینێ تەگەلنی» خەڵاتی یەکەمی لە پێشبڕکێی شیعر و چیرۆکی گۆڤاری ڤاتە بردووەتەوە. هەروەها ئەندامی گرووپی ڤاتەیە و هەوڵیان بۆ بەستانداردکردنی کرمانجکییە. هەنووکە لە بەشی زمانناسیی زانکۆی بامبێرگی ئەڵمانی خوێندکاری ماستەرە.

## غەریب

زێدی ڕۆحم ئێرە نییە، دەزانم...
یان ترۆپکی چیایەکە، شەختەیە، زاڵمە
یان گەرمەدەشتێکە، پرپشکە، ئاگرە
ژانی زۆرە، سکاڵای زۆرە، هیوایەکی بێکەسە
لە قوتووە زیوینەکەی ناو سنگمدایە
مەکەوە هەڵپە، هەڵپە گڵاوکەری نامووسی ئەم ڕۆحەیە
وەک شنەبای کوێستان نەرمەنەرمە ماچم بکە
بۆ خاتری لەعنەتەکەت پێم ببەخشە جووتێک پەڕوباڵ
با بڕۆین، با بەرەو ئاسۆ بدەین لە شەقەی باڵ.

٦ی جەنیوەریی ٢٠١٦، ئەرخەنی



## Xerîb

Royê mi îta ra nîyo, ez zana...
Yan gilê ju koyî ra wo, cemed o, xedar o
Yan germê ju deşte ra wo, çîk o, adir o
Xeylê dejî, xeylê qesey û omidêdo bêkes
Qutîya sêmêne de, pistinê mi dir o
Lez meke, lez herimneno namusê nê royî
Nermik-nermik lew mi ra ne, zê honikê koyî
Çutê perran bexşê mi ke, xatirê lanetê xo şane
Biterkinîme, biperrîme ver bi asoyî

*06.01.16, Erxenî*

# سیمورغ

وشەی زمانێکم من
کە تەنیا لە سترانەکاندا ماومەتەوە
کەڤرێکی نەخشینم
کە لە بن خۆڵ و تەپۆڵکەدا ماومەتەوە
من غەریب و نامۆ ماومەتەوە
من بێ بیر و بێ هۆش ماومەتەوە
ماومەتەوە بێ مەی و بێ جام
دەست و پێم توند بەستراونەتەوە
بە خونچە و چرۆکانم، داخی گرانم!
لە بن هەرەسدا ماومەتەوە

میواکانم ئاسان ناڕوێن
زەوییەکانم چۆڵوهۆڵن بەهاران
دەڵێن سوێندی گەورەت خواردووە
دەڵێن ئەوەی نەدەبوو بکرایە کردووتەوە
دەڵێن چوویتەتە سوجدە
بە سنگێکی ئارەقاوییەوە
گوناحبارێکی وەهام کە
نە لە بەهەشت نە لە ئاگری دۆزەخدا جێم نابێتەوە
لەعنەتکراوێکی بێدەرمانم لە بەرزەخدا ماومەتەوە
سیمورغێکی بریندارغم لە پشت قافدا ماومەتەوە



## Sîmurx

Çekuyêda ju ziwanî ya ez
ke tenya kilaman de menda
Kemerêda neqişin a
ke binê herr û pulan de menda
Ez menda bîyaxkî û xam
Ez menda bêvîr û bêfam
Menda bêmey û bêcam
Dest û payê mi kîpakîp beste,
Bi lîzg û vilîkanê xo, heyfo giran!
Binê hewrêsan de menda

Omidê mi nêrewînê hal bi hal
Hêgayê mi wisaran de tipûtal
Vanê to sondê giranî werdê
Vanê ê yê ke nêbenê, to kerdê
Vanê ti şîya be sizde
sêneyêde araqinî ser de
Gunekaro henên a ke
Ne cenet ne kî adirê dozî,
Lanetîyêdo bêderman a, arafan de menda
Sîmurxo birîndax a, peyê Qafan de menda

دڵەکەم! چی تۆی هێنایە ناو سەرمەوە؟
چما ئاوە زوڵاڵەکەمت بە لێوت لێڵ کردووە؟
"نە میرانی وڵاتەکەم نە میرانی وڵاتانی دیکە
نەیانویستم، منیان لە خۆیان دوور خستەوە
بچمە کوێ، چی بکەم؟
خوایە گیان! پێم بێژە،
چۆن دڵخۆشت بکەم؟"
وەک بولبولی بێپەڕ و بێبالانە
لە دەشتی بێدار و بێبەرددا ماومەتەوە
لە خاکەکەم دوور کەوتوومەتەوە،
منی داماو لە وڵاتی تردا ماومەتەوە.

١٩ی ئابی ٢٠١٨



Zerrîyê, no çi bî to ard nê sereyê mi ser de?
Çira awa min a zelale bi ê lewan lêl kerde?
"Ne mîreyanê welatê mi ne kî yê welatanê bînan
Ez nêwaşta, ez dûrî kerda xo ra înan
Kata şêrî, ez se kerî?
Heqo comerd! Vaje mi ra,
To çitur zerreweş kerî?"*
Zê bilbilê bêperr û halêne
Raşteyanê bêdar û tatan de menda
Herdê xo ra kewta dûrî, xo rê welatan de menda

*19 tebaxe 2018*





## بەدریە تۆپاچ

شاعیر و چیرۆکنووس و وتارنووسە. ساڵی ١٩٧٧ لە گوندی مارکاسۆر لە ناوچەی قسلەی سەر بە پارێزگای دێرسم هاتووەتە دنیاوە. خوێندنی سەرەتایی لە دێرسم، ناوەندی و دواناوەندیی لە ئەنقەرە خوێندووە. شیعر و وتار و چیرۆکەکانی لە ساڵی ٢٠١١ـەوە لە ئەوەپەل، شەوچلە، ڤاتە، ئازادییا وەلات و نووبهاردا بلاو بوونەتەوە. وەشانخانەی ڕۆشنا لە ئامەد کتێبی بەرۆ سوور (٢٠١٢) و وەختێ حەسکەردشی (٢٠١٣) بڵاو کردووەتەوە، پاشان وەشانخانەی ڤاتە لە ئەستەمبوول کتێبی مەنەوشی (٢٠٢٠) وەشاندووە.

## میوانی چاوم

چاوت دێت، بەخێر بێت
زۆر دەمێکە باران نابارێت

دەنگت دێت، بەخێر بێت
زۆر دەمێکە مەل دەرناکەوێت

تۆ دێیت، بەخێر بێیت
سەرسەر و سەرچاوم بێیت

ڕووخسارت دێت، بەخێر بێت
زۆر دەمێکە کێو خۆی نانوێنێت

بۆنت دێت، بەخێر بێت
زۆر دەمێکە بەهار نایەت

تۆ دێیت، بەخێر بێیت
سەرسەر و سەرچاوم بێیت



## Mêmanê çimanê mi

Çimê to yenê, xêr yenê
Xeylê wext o ke şilî çin ê

Vengê to yeno, xêr yeno
Xeylê wext o ke mîlçikî çin ê

Ti yenî, xêr yenî
Sere û çimanê mi ser yenî

Rîyê to yeno, xêr yeno
Xeylê wext o ke koyî çin ê

Boya to yena, xêr yena
Xeylê wext o ke wisarî çin ê

Ti yenî, xêr yenî
Sere û çimanê mi ser yenî

# من و تۆ

تۆ دەڵێیت ئەستێرە
من دەبمە ئاسمان

تۆ دەڵێیت ئاگر
من دەبمە سەرهەڵدان

تۆ دەڵێیت قەڵس
من دەبمە هەرەس

تۆ دەڵێیت دڵ
من دەبمە تۆ



## Ez û ti

Ti vanî astare
Ez bena asmên

Ti vanî adir
Ez bena serewedaritiş

Ti vanî hêrs
Ez bena vewrês

Ti vanî zerrî
Ez bena ti





## ئیدریس یازار

شاعیر و وتارنووسە. ساڵی ١٩٨٣ لە گوندی برجک لە ناوچەی میرانی سەر بە پارێزگای خارپێت هاتووەتە دنیاوە. سەرەتایی لە گوند، ناوەندی و دواناوەندیی لە میران خوێندووە. بەشی ئینگلیزیی لە زانکۆی مونزور و بەشی فەلسەفەی لە زانکۆی ئەنادۆڵ تەواو کردووە. ساڵی ٢٠١١ دەستی بە نووسین بە زمانی دایکی کردووە. سێ بەرهەمی چاپکراوی هەیە: وەشانخانەی ڕۆشنا لە ئامەد کتێبی جمێ ئاشکان را حەوت حکایەیێن گەلێری (٢٠١٨) و دەستێ زەمانی (٢٠١٨)ی بڵاو کردووەتەوە، پاشان وەشانخانەی ڤاتە لە ئەستەمبوڵ کتێبی دەیرانێ قەرەبەگان و سیوانی سەر ئۆ (٢٠٢٠)ی وەشاندووە.

## پەیکی کازیوە

حەماڵی بە خەون و خەیاڵەوە ناکرێت
دەڕۆم تا هۆشم لە ناو سنگمدا هەڵتدەگرێت
ئەی دەزانیت مەودابڕین بە دڵ چۆنە؟
دەبیبستم نزگەرەی ئەو چیایانەی لە نێوانمانە
دەبمە هاوشێوەی ئەو دارەی چرۆکانی ژاکاوە
دەستپێکی هەموو وەرزێک چاوەڕێی بارانی تۆمە
لەسەر سنگت خەونێکی ساوام دەویست
تا بە لێوت کازیوەم دەست پێ بکات
حەیف، ئەمەیش بووە چیرۆکی بەر ئاگردان
پاڵەپی لەسەر خاکەکەم و خۆشویستنم بۆت

ئەو دڵدارییە ئەفسووناوییانەی لە ئەفسانەکاندا ماونەتەوە
بە هەموویان خۆشم ویستیت و چاولەڕێت مامەوە
ئەو بڕوایانەی شارستانیەتەکان بە خوڕافە ناوی دەهێنن
بە هەموویان لە خوداکان لاڵامەوە و هەر داوای تۆم کردووە
لە هەموو جێیەکی پیرۆز و لە هەموو ئایینێکی عیرفانی
هەر بە حەسرەت و ئەشق و خەیاڵی تۆوە سەرمەست بووم
چەندین دەریا لە سنگمدا خنکاون، کەس پێی نەزانی
ئاخ دڵ! تەنێ تۆ دەزانی چ ددانەجیڕەیەکمان پێ کەوتووە

ماوەیەکە تێگەیشتووم بەردە کەڵەکەکان
بەشی دیوارە ڕماوەکانی دڵم ناکەن
ئەو دەمەی هەموو دەرێ بۆ ئازاری دی دەکرێنەوە

## Qasida şefeqî

Hemaltîya xeyalan û hewnan nêancîyena
Ez se ra şîrî zî hîşê mi to kirêşeno berzînê mi
Ti zana bi zerrî mesafe peymawitiş senîn o?
Ez zîniskanê koyan eşnawena mabênê ma de
Ez bena sey dara ke, gilçeyê xo pulisîyaye
Varanê to pawena destpêkê her mewsimî de
Mi sêneyê to ser o hewnêkê yew saba waştêne
Ke bi lewanê to şefeqê mi dest pêbikerê
Heyf ke na zî bîye yew sanika verê pixêrîyan
Serê herra xo de mirêbayî û to ra heskerdişê mi

Heme eşqê efsûninî ke efsaneyan de mendî
Mi bi înan zî to ra hes kerd û rayîrê to pawit
Heme bawerîyê ke medenîyetan ci ra vato xurafe
Mi bi înan zî venga homayan da û tena ti waşta
Heme cayê pîrozî û heme ayînanê mistîkan de
Ez tena bi hesret, eşq û xeyalê to sermest bîya
Sêneyê mi de çend behrî fetisîyayî, kesî nêzana
Ax zerrê! Tena ti zana ke êdî bîyê bal dejê ma

Wextêk ra pey mi têvet ke ê kerreyê ke arêbîyê
Êdî qîm nêkenê ê dêsê rijîyaye yê zerrîya mi rê
Gama ke heme berengeyî yewna dejî rê bibê a

ئیدی هیچ سنگێک نییە سەرمی لەسەر دابنێم
کێ دەوێرێت، کێ خەوی دەڕەوێتەوە گەر بقیڕێنم؟
بینیم تێکەڵ بوون ڕق و ڕەحم و ڕیا
ئیدی دەبمە چی؟ دەبمە چەند پارچە؟
دەستوپلم چۆلوهۆڵە، ولاتەکەم دنیای داڵدە داوە

تۆ ئەمێستا لەوێ لە ڕۆحتدا بەو دۆزەخە
پشکۆی ئاگریش شەرمت لێ دەکاتەوە
منی بێکەس دەیان کیلۆمەتر دوورم لێتەوە
تۆ وەک فریشتەی شەو دەمخەوێنیتەوە
و وەک پەیکی کازیوە خەبەرم دەکەیتەوە
شنەبایەک هەڵدەکات لە کێوە غەریبەکانەوە
بۆنی ڕووەک و دەریا دێنێت لێ نایانناسمەوە
بەو خودایە، من حەزم لە دەریا نییە
شوێنێکی تۆی لێ نەبێت، چیم لە مسک و عەمبەر داوە

شەپۆلی پەژارەت هەڵیدەوەرێنێ گەڵای داری ژیان
دڵ بە تاقی تەنیایە لە ئامێزی خەزان
لە ناو مندا شلێرە سەر دەردەهێنێت
لێ دەمەو چلە لە بەردەم ڕۆحی گوڵزارەکەم
تۆ ئاگرت خنکاند بە خەم و خەفەتت
من توورەکەکانم ئاخنیوە تەنێ بە حەسرەتت
تاریکەشەوە، بێڕەحمەشەوە، تۆیش دووریت
تێگەیشتم بەبێ تۆ ژینم هەمووی عەزابە

Êdî tu sêne est o ke sereyê mi ser o bindar bigiro
Kam etirîyeno, hewnê kamî remeno eke ez  biqîra?
Mi dîy kewtbî têmîyan rike û rehme û rîya
Ez do hima se bibo, do bibo çend leteyî?
Wirdêsê mi vik û vengî, welatê mi dibrîyê dinya

Ti nika uca de ruhê xo de bi ê cehenemî
Tiramê adirî zî hinî to ver a şerm kenî
Ez tîya de bêkes bi kîlometreyan to ra dûrî
Ti sey yew milakcta şewe mi hewn a kena
Û ti sey yew qasida şefeqî mi hîşyar kena
Nijgilêka  nermek yena koyanê xerîban ra
Boya nebatan û behran ana la mi rê xam î
Xora Homay ra yo, ez hes nêkena behran ra
Cayo ke ti çin ba, ez se bikero misk û amberî

Pêla kula to pelan rişnena dara cuye ra
Zerrî verara yew xezanî de tekûtena
Zereyê mi de heylanikî sere wedarenê
La qeraxê çeleyî de gankêş o gulzarê mi
To adirî fetisnayî bi kilan û kulanê xo
Mi pêlekê xo dewisnayî tena bi hesreta to
Şewî tarî yê, şewî bêrehm ê, ti zî dûrî ya
Mi zana ke bê to cuya mi pêro yew tew a

ڕۆژێکی دی خۆر لە چیای کۆتۆر ئاوا دەبێ
من دیسان ژانێک دەمەیەنێم لە بن لێفەیێ
ئارەزوویەک لە دوورەوە کە ئاگر تاقی کردووەتەوە
سەروەختێک بینیم، ئەو کاتەی کە ناسیمەوە
لەوساکەوە هیچ برینێکمت قبووڵ نەکردووە
مرۆڤ لە هەر کوێ بێت هەردەم سەر بە خاکی خۆیە
دە نا بۆ چی "لە ستۆکهۆڵم بە دوای مازوودا دەگەڕێم"
بچمە هەر کوێ خەفەتی ئەم بیرکردنە هەردەم باری دڵمە

لە قوژبنی هەندێک دڵدا، لەودیو قسە و زانینەوە
هەندێک ئەڤین دەمێننەوە، ئەڤینی ڕاستینە، ئەڤینی بێوێنە
وەک لەوحەی سەردەمی زوو لە سنگدا میروولە
وچانیان داوە، لە سارد و سەرما ماونەتەوە، خوێنیان هەڵهێناوەتەوە
مانەوەیان لە بەردەم سەدەکاندا وەک پەیکەرە، وەک یادگارییە
لە خۆڕا نەیانگوتووە "دڵ پیاو دەخوات" دڵ بێپەروایە.
دەم و ساڵ تێدەپەڕن، شوێنەکانم بە فیزیکی دەگۆڕێن
لە هەموو تەمەنمدا بوومەتە بەتاڵیی بەتاڵییەک،
من بە تۆ پڕم کردبوو هەموو درز و کەلێنێکی ناخم
هێشتا ئەم ڕۆژانەیش ئاوارە دەبن لەسەر شانشینە ڕماوەکان.

کۆتۆر، زستانی ٢٠٢٢

Hewna roj ha şino awan koyê Kotorî ser ra
Ez hewna dejêk mîraz kena binê lihêfêk de
Dûrî de waştîyêk, bi adirî ameya ceribnayene
Gama ke aye dî, gama ke mi a nas kerd
Weyra ra pey êdî tu darba mi tutin qebul nêkerd
Merdim ça de bibo zî aîdîyet tim herra xo ya
Nêke kê çira "Stokholm de mazîyan geyrenê"
Ez se ra şêra zî kula na bêrî tim barê zerrî ya

Hokanê tayê zerran de, vate û zanayîşan ra teber
Tayê eşqî manenê, eşqê rastikênî, eşqê bêhempayî
Seke tabletanê wextanê verînan ra pistan de morêk
Va werdo, serd û seqem de mendê, gonî qelibnaya
Verba esran de mendê sey peykerêk, sey abîdeyêk
Bilasebeb nêvato "zerr kê wena" zerrî bê perwa ya
Wextî û serrî vîyarenê, fîzîkî cayê mi bedilîyenê
Pêroyê emrê xo de ez venganeyê yew venganî bîyo,
Mi bi to pirr kerdbî heme terk û qulê zereyê xo
Hema zî ez ha rojan bena awan a paga xiraba ser o

*Kotor, zimistan 2023*

## تێبینی

**هێراکلیتۆس**

پۆلێمۆس (Polemos) یۆنانییە، واتا جەنگ.

پانتا ڕەی (Panta Rhei): یۆنانییە، واتا هەموو شتێک دەجووڵێت.

**ڕەحمەت شەریفی سەردەشتی**

ئەو وێنەیەی UPI کە خەڵاتی پۆلتیزەری وەرگرتبوو، نیشانی دەدا چۆن داروەستەی خومەینی کورد دەکوژن.

زانیاریی زیادتر:

https://www.pulitzer.org/article/anonymous-no-more

**سیمورغ**

چەند دێڕێکی ئاڤێستایە.



# Notî

## "Herakleîtos"

Panta rei: (yunankî de) heme çî herrikîyêno.
Polemos: (yunankî de) lej, ceng.

## "Rehmet Şerîfîyê Serdeştî"

Fotografo ki Photo UPI kaşkerdbi û xelata Pulitzerî girewtibî, nawitînî (musnaynî) ki mêrdimê Xumeynî sencêhawa kurdan kişenê.

## "Sîmurx"

Avesta ra çend rêzî.

# ژیاننامه

**ژیار هۆمەر** (Jiyar Homer) وەرگێڕ و نووسیارە، لەدایکبووی سلێمانییە، وەرگێڕی ویژەی ئەمریکای لاتین بۆ کوردی و ویژەی کوردی بۆ چەندین زمانە، لەم سۆنگەیەوە بەرهەمی پتر لە ۱۰۰ نووسەری کوردی لە سەروو ۳۰ وڵات بڵاو کردووەتەوە. نووسیاری گۆڤاری ئیلیان و وەشانخانەی باڵندەیە. ئەندامی ناوەندی کەشکۆڵ لە زانکۆی ئەمریکی لە عێراق، سلێمانی (AUIS) و ناوەندی پێنی کورد (Kurdish PEN) لە ئەڵمانیایە. کتێبی خوان کارلۆس ئۆنێتی و کارلۆس ڕویز زافۆن و شێرزاد حەسەن و فەرهاد پیربالی وەرگێڕاوە.



*Mi nombre es pecado: Antología de poesía Kirmanjki (Zazaki)*
Ed. Jiyar Homer
Translated by Jiyar Homer and Shook
Poetry (Spanish/Kirmanjki)
ISBN: 978-9922-9257-8-3

**Kashkul World Literature**
Juan Carlos Onetti (Uruguay)
*El pozo*
Translated from the Spanish by Jiyar Homer
Novel (Central Kurdish)
ISBN: 978-9922-9257-4-5

**Theater**
Berhem Anwer
*Snakes and Ladders*
(Central Kurdish)
ISBN: 978-9922-9257-1-4

Berhem Anwer
*Two Plays: The Untimely Guest and Waiting*
(Central Kurdish)
ISBN: 978-9922-9257-2-1

**Art Exhibition Catalogues**
*Through the Smoke, Behind the Curtain:*
*The Photography of Hawre Khalid*
Ed. David Shook
(English/Central Kurdish)

*The Stone Man: An Ismail Khayat Retrospective*
Ed. Alana Marie Levinson-LaBrosse
(Arabic/English/Central Kurdish)



# Recent Titles from



# Kashkul Books

**Kashkul Classics**

Nali

*My Moon Is the Only Moon*

Translated by Tyler Fisher, Haidar Khezri,
Alana Marie Levinson-LaBrosse, and Shene Mohammed

Poetry (English/Central Kurdish)

ISBN: 978-9922-9257-3-8

**Kashkul Contemporaries**

Zêdan Xelef

*A Barcode Scanner*

Translated by Bryar Bajalan and Shook

Poetry (Arabic/English)

ISBN: 978-9922-9257-0-7

Farhad Pirbal

*Refugiado número 33333*

Translated into Spanish by Jiyar homer and Shook

Poetry (Spanish/Central Kurdish)

ISBN: 978-9922-9257-5-2

*My Name Is a Sin: An Anthology of Kirmanjki (Zazaki) Poetry*

Ed. Jiyar Homer

Translated by Jiyar Homer and Shook

Poetry (English/Kirmanjki)

ISBN: 978-9922-9257-7-6